# کۆلارە

گۆڤاری منداڵانی تەمەن ٩-١٥ ساڵانە

بەدەم خوێندنەوەی کۆلارە
ئەم مژمژەیە تام بکە











نرخی
کۆلارە
٤٠٠ دیناره

# بەرگــدرووی ئازا

نوسینی : برایانی گریم
نوسین و نیگـار : یورگین کونەر
وەرگێرانی: ئەحمەد قادر سەعید



بەرگدرووەکە لەو مێشانە دەدا، کەبەدەوری ئەو سەندوویچەدا بوون کە مربای بەسەردا کرابوو، بۆیە جارێکیان بەتووڕەییەوە مێش کۆکوژەکەی بەرزکردەوەو کێشای بەسەری مێشەکانداو حەوت دانە مێشی بەجارێك لێکوشتن.



پێویست بوو ئەو کارە گەورەیە هەمووکەسی لێ ئاگادار بکرایەتەوە. بەرگدرووەکە دوای بیر کردنەوە، پشتێنێکی فراوانی بۆ خۆی چنیی‌و لەسەر پشتێنەکە نووسیبووی (حەوت مێش بەیەك لێدانا)



خەڵکی کە ئەوەیان بیست بەسەر سوورمانەوە لەکارەکەیان روانی و پێیان وابوو کارێکی یەکجار مەزنی کردووە. کە حەوت مێشی بەیەك پێداکێشان لەناو بردووە.



هەواڵی ئەو رووداوە گەیشتە پاشاو پەیمانی پێدا کە کچە شازادەکەی خۆی لێ مارە ببڕێ ئەگەر توانی ئەو دوو چەتە گەورەیە لەناو بەرێت، کە لەدەرەوە زیان بەخەڵك دەگەیەنن و جەردەیی دەکەن.



بەرگدرووکە لەسەر درەختێکدا، بەردی گرتە هەردوو چەتە نووستووەکان، وکاتێك خەبەریان بووە، هەریەکەیان ئەویتری تاوانبار کرد، کە بۆوەتە هۆی پشێووی و خەوزڕانی ئەوی تریان.



دوو چەتەکە بەجۆرێك کەوتنە گیانی یەکتری کەیەکیان ئەویتر لەناو ببات. لەکاتی شەڕکردنیاندا پەلاماری درەختێکیاندا و لەرەگەوە، هەڵیان کەند و ئەوەش بووە هۆی دەوربەریان بلەرزێتەوە.



لەئەنجامدا هێندەیان لەیەکتریدا، یەکتریان کوشت. بەرگدرووەکە زۆر دڵخۆش بوو کەلەکاتی شەڕکرنیاندا ئەو درەختەی ئەوی بەسەرەوە بوو، نەکەوتە بەر هێرشی هەڵکەندن.



بەڵام پاشا پەیمانی خۆی نەبردەسەر، بەڵکو داوای لێکرد ئەو ئەسپە یەك شاخە لەناو بەرێت کەلە دارستاندا دەژیت و زیانێکی زۆری بەخەڵك‌و دانیشتوان گەیاندووە.



ئەسپە شاخدارەکە هێرشی کردە سەری بەڵام بەرگدرووە ئازاکە بەخێرایی خۆی خستە ئەو دیوو درەختێکی گەورە، بۆیە شاخەکەی بەقووڵی چەقییە ناو درەختێکی



بەگدروو شریتێکی بەهێزی خستە ملی ئەسپەو شاخەکەشی بەتەور بڕی ئازایانە سواری سەر پشتی ئەسپەکە بوو و بردیە بەردەم پاشا.



بۆیە پاشا هیچی بەدەستەوە نەما، بەناچاری کچەکەی دابە بەرگدرووەکەو زۆری نەخایاند ئاهەنگێکی شایستەیان بۆ رێکخستن‌و لەدواجاردا شازادەو بەرگدرووکە بەرەوە ماڵەوە گەڕانەوەو خەڵکێکی زۆر پێشوازیان کردن‌و بەرگدرووەکەیان وەك پاڵەوانێتی گەورە بەخەڵکی‌تر ناساند.

تەواو بوو

کۆلارە

هەفتەنامەی منداڵانە

تایبەتە بەو منداڵانەی کە
تەمەنیان لەسەرووی ٩ ساڵیدایە
کۆلارە درێژەپێدەری گۆڤاری پەرسێلکەیە

خاوەن ئیمتیازو بەڕێوەبەری گشتی
هەڵگورد عبدالوهاب

سەرنووسەر
ئیدریس لاوە

هاوکاران
ئەحمەد قادر سەعید
بێستون فەرهاد شاکر
ئەبوبەکر قەرەداغی
ستار قادر

web master
سەدرەددین ئەحمەد عەزیز (ئوستralیا)

پۆستی ئەلکترۆنی:
halgurd99@maktoob.com

ناونیشانمان لە تۆڕی ئینتەرنێتدا
www.kolara.4t.com

ناونیشانمان
کوردستان ، سلێمانی، شەقامی سالم، باڵەخانەی ئاوا نهۆمی دووەم

ناونیشانمان بۆ دەرەوەی وڵات :
iran
کردستان - بانە
P.O.BOX : 66915-155
(٢٧٢) گۆڤاری کۆلارە

یان لەرێی ئەدرەسی سەرنووسەر:
E.LAUA
BLUCHER STR.25
90439 NURNBERG
GERMANY

دەتوانن ئیلتزامە مادییەکانتان لە رێی ئەم ژمارە بانکییە رایی بکەن:
konto: EDRESS LAUA
Stadtsparkasse nurnberg
(BLZ 760 501 01)
kto:1836383

نرخەکانی کۆلارە
کوردستان: ٤٠٠ دینار
ئێران : ٤٠٠ تمەن
ئەورووپا : دوو یۆرۆ
وڵاتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا : ٢ دۆلار

لەکاتی ناردنی گۆڤار بۆ هەر کەسێك ئەوا ئەرك و تێچوونی پۆستکردن دەکەوێتە سەر ئەو کەسەی گۆڤارەکەی بۆ دەنێردرێت

بۆ بلاوکردنەوەی ریکلام و جار راستەوخۆ لە رێی پەیوەندیکردن لەگەڵ سەرنووسەر یان بەڕێوەبەری گشتییەوە دەبێت


# چاوتان روون



کاتێك کە سەدام حوسێن منداڵ بوو لەوانەیە هەر وەکو ئێوە وابوبێت، بەڵام چۆن بوو بەو کەسەی کە هەموو دونیای ترساند و خەڵکێکی زۆری ماڵوێران و شوێن بزر کرد.

تەماعکاری بێویژدانی وای لەو کرد کە ببێتە ئەو درندە ترسناکە، ئەو سێوێکی لەدەست دابوو بەڵام بەو تاکە سێوە رازی نەبوو بەڵکو دەیویست سێوی دەستی من و دەستی تۆ و هەموو سێوەکانی تری جیهان بۆ خۆی بێت.

سەدام گوێ بەمنداڵ و پیرو گەنج نەدەدا، بەڵکو لای ئەو هەموو کەس باخەوانی سێوەکانی ئەو بوون، بەبێ ئەوەی مافی ئەوەیان بداتێ کەسێوێك بۆن بکەن، ئەگەر بۆنیشیان بکردبایە یەکسەر دەمردن..!

لە سایەی سەدام سێوەکان کرمی بوون، پوچ و بچووك بوون گەڵای دارەکان هەمیشە زەرد، رەگەکانیان هەمیشە تینو بۆ ئاو. ئێست سەدام و خراپکاریەکان نەمان، دیسان خۆری جوان بەسەر باخی سێوەکانی نیشتیماندا هەڵات، سێوەکان واخەریکە گەش دەبنەوە رەگ و گەڵا پیرو وشك هەڵاتوەکان خەریکە نوژەن دەبنەوە خۆمان ئامادە کردووە، بۆ ئەوەی هەموومان پێکەوە دوور لەسەدام سێوەکان بۆن بکەین و چاومان بە رەنگی سوور وسەوزو زەردی سێوەکان گەش ببێتەوە.

ئیتر لەمەولا کەس ناتوانێ هەموو باخە سێوەکان بۆ خۆی داگیر بکات بەڵکو هەمووان خاوەنی باخی سێوین و سێویش بۆ هەموانە..

کۆلارە



# مێرد منداڵانی هەڵگری ئۆسکار

### ئامادەکردنی: گەشبین ئەبوبەکر



لەمێژووی سینەمادا چەندین ئەکتەری بلیمەتی منداڵ ومێردمنداڵ بەرچاودەکەون کەتوانیویانە خەڵاتی ئۆسکار بەدەست بهێنن. هەندێك لەوانە توانیویانە وەك فیلمکارێك درێژە بەتواناکانیان بدەن وشوێنگەیەکیان لەوبوارەدا هەبێ. بەلاّم ئەوانی تریان تائەو کاتەی خەلاّتەکەیان بەدەست هێناوە ئیشیان کردووە دوایی وردەوردە کە گەورە بوون بۆ یەکجاری بوارەکەیان بەجێ هێشتووە..

یەکێك لەوانە(ئانا پاکویین)ە کەلەبەر ئەورۆڵە هونەرمەندانەیەی لەفیلمی (پیانۆ)دا بینی خەلاّتی ئۆسکاری رۆڵی دووەمی ژنی بەدەست هێنا کەئەوکاتە تەمەنی (١١) ساڵان بوو(ئانا) دوای ئەو سەرکەوتنە گەورەیەی کەلەرێو رەسمی ئۆسکاری ساڵی١٩٩٣دا بەدەستی هێنا بەرێنمایی دایك وباوکی بەباشی وبەلێهاتووی درێژەی بەکارە هونەریەکانیدا و ئێستا لەتەمەنی (٢٠) ساڵی دایەو فلیم کارێکی کارای بواری سینەمایە وساڵی پاریش لەچەند فیلمێکی تردا دەرکەوت، (ئانا) لەدایك بووی نیوزلەندەیە. هەڵبەتە لە(ئانا)بچوکتر هەیە کەتوانیویەتی لەتەمەنی (١٠)ساڵیدا خەلاّتی ئۆسکار بۆخۆی بپچڕێ.لەساڵی ١٩٧٣دا کیژۆڵەیەکی تر بەناوی(تاتوم ئونیل)بە هۆی ئەو رۆڵەی لەفیلمی (مانگی کاغەزی)دا بینی، توانی خەلاّتی ئۆسکار بەدەست بێنێ، ئەولەو فیلمە لەگەڵ (رایان ئۆنیل)ی باوکیدارۆلی دەبینی.

بەلاّم (تاتوم) بەپێچەوانەی (ئانا)وە نەی توانی درێژە بەکارەکەی بدات وپلەو پایەکی ئەوتۆی لەبواری سینەمادا هەبێ. دوای فیلمی مانگی کاغەزی لەچەند فیلمێکی بێهێزدا دەرکەوتووە. ئەو کەئێستا تەمەنی (٣٩) ساڵانە و بەتەواوی وازی لەسینەما هێناوە ■

# خۆتان لە سەرما بپارێزن

KHF

هەفتەی رابردوو کاتێك باران بەخوڕ دەباری، زۆرم حەزمکرد چەترەکەم تاقی بکەمەوە بۆیە شاهۆی هاوڕێم بانگ کرد ، ئەگەرچی شاهۆ حەزی نەکرد بێتە دەرەوە و وتی: (ساردە نەخۆش دەکەوین) بەلاّم دوای پاڕانەوەی زۆر رازی بوو بێتە دەرەوە.

هەردووکمان بە جووتە زۆر گەراین و سوڕاینەوە ، بارانیش تا دەهات بە خوڕتر دەبوو تا وای لێهات لافاو هەڵسا، ئێمەش بەتەواوی تەڕ بووین.

ژێر چەترەکەم زۆر خۆش بوو بەلاّم نەمانزانی کە ئەو گەشت و گەڕانە تووشی نەخۆشیمان دەکات.

ئێستا هەردووکمان نەخۆش کەوتووین و لە خوێندن دابڕاین و هەموو رۆژێك دوو دەرزیشمان لێدەدرێت.

راستە چەترەکەم زۆر جوانە بەلاّم جوانتر دەبوو ئەگەر بە باشی بەکارم هێنابا، ئێستا زانیم کە هەرچەند بەفرو باران پاك و جوان بن ، دوو ئەوەندە زیان بەخش و مەترسیدار دەبن بۆ ئەو کەسانەی کە بێباکن لە سەرماو سۆڵەی زستان ■

**KHF**

**دەزگای تەندروستی کوردستان**

فۆتۆ : کەیوان سەعید

# بابا نوئێل

ئا: بێستون فەرهاد شاکر

بابا نوئێل ئەو پیرە مێردە میهرەبانەیە کە هەمووساڵێك لە ٢٥ ی کانوونی یەکەمدا دیاری بۆ منداڵانی جیهان دێنێتو بەسواری گالیسکە زێرینەکەی کە دووئاسکی خنجیلانە رایدەکێشن، ئەمەش لە زۆربەی فیلمە کارتۆنییەکاندا دەردەکەوێ.





لە ساڵی ١٨٢٢دا زانایێکی ئایینی ئەمریکی بەناوی کلیمان کلارك مۆر هۆنراوەیەکی بۆ منداڵان نووسی باسی بابا نوئێلی تێدا کردبوو. ئەوە بوو هۆنراوەکە سەرکەوتنێکی گەورەی بەدەست هێناو وێنەکێشێك بەناوی تۆماس فاست لەگەڵ هەندێك وێنەکێشی‌تر هەڵستان بە وێنەکێشانی بابا نوئێل. لەساڵی ١٩٠٠ ناوبانگی بابا نوئێل لەئەمریکا گەیشتە لوتکە، بەڵام تاوەکو ساڵی ١٩٤٨ ناوبانگی لەئەوروپا دەرنەکردبوو.

ئاوەها بابا نوئێل لە هەموو جیهاندا جێی خۆی لەناو دڵی منداڵان کردەوە، بە پاڵتۆ سوورەکەی‌و ریشەسپییەکەی‌و ئاسکە جوانکیلەکانی‌و گالیسکە زێرینەکەی بووە هێمای خۆشی‌و میهرەبانی‌و خۆشەویستی بۆ منداڵان لەهەرکوێیەك بن ■



# پاڵەوانێکی بچوك



دەریا پاڵەوانێکی چەلەنگ و چاوگەش و زیرەکە ، ئارەزووی لە وەرزشی (کاراتێ) یە، بەردەوام هەوڵی زیاتری بۆ دەدات، زۆرتر ڕاهێنان دەکات بۆیە تائێستا توانیویەتی چەندین مەدالیاو سەرکەوتن بەدەست بهێنێت.

دەریا نامیق لەدایکبووی ساڵی ١٩٩٠ی شاری هەولێرە ولە پۆلی دووەمی ناوەندییە. کۆلارە بەپێویستی زانی بەسەری بکاتەوەو چەند پرسیارێکی ئاراستە بکات ئەویش ئاوا بۆمان دواو وەڵامی دایەوە:

زۆر حەزم لەم وەرزشەیە ، لەساڵی ٢٠٠٠ بوومە ئەندامی بەشی کاراتێ لە یانەی هەولێر، تا ئێستا لە کۆمەڵێ پاڵەوانیەتیدا بەشداریم کردووەو زۆربەی جاریش خاوەن پلە بووم بەم شێوەیە :

لەسەر ئاستی عیراق لەپاڵەوانیەتی ٢٠٠١ پلەی یەکەم و لەپاڵەوانیەتی ٢٠٠٣ پلەی سێهەم بووم دوو بڕوانامەی یەکێتی مۆندیالی عیراقم وەرگرتووە.

لەسەر ئاستی کوردستان لەپاڵەوانی ٢٠٠٢ پلەی دووەم بووم.

لەسەر ئاستی هەولێر شەش جار یەکەم وجارێکیش دووەم بووم.

خاوەنی شەش پشتێنم ، تەنها پشتێنی ڕەش ماوە کەبیبەستم دیارە ئەو قۆناغەشم تەواو کردووە بەڵام لەبەر نەبوونی ڕاهێنەری خاوەن بڕوانامە ئەو پشتێنەم وەرنەگرتووە.

لەساڵی ٢٠٠٣ بووم بەڕاهێنەری منالآن لەیانەی هەولێر.

ئەو سەرکەوتنانەم بۆیە بەدەستهێناوە چونکە ئارەزوو و



خۆشەویستی زۆرم هەیە بۆ ئەم یارییەو هەروەها هاندانی برای خۆشەویستم کاك شەهرام وکاك مەریوان ئەحمەدی ڕاهێنەریشم وایان لێکردم بەم شێوەیە سەرکەوم.

هیوادارم وەك منداڵانی جیهان شوێنی تایبەتمان بۆ دابین بکەن چونکە هیچ جیاوازیەکمان لەگەڵ ئەواندا نییە.

هەروەها پێویستە بە دۆستانی کۆلارەو هاورێیانم بڵێم کە (کاراتێ) ڕەوشتەو وەرزشی ئازایەتی و دانبەخۆداگرتن و جوولەی جوانەو دوورە لە توندو تیژی و ئازاردانی خەڵکانی تر.

ئامادەکردنی: کەیوان سەعید

# شاسوار بەدوای قارچکدا دەگەڕێ



کەمەوە / ئەبوبکر قەرەداغی



شاسواری بچکۆڵە بەکەلوپەلی یارکردنەکانی سەرقاڵی یاریکردن بوو. لەناکاو دەنگی دایك و باوکی بەرگوێ کەوت کە وتیان:- شاسوار وەرە، دەمانەوێ بۆ قارچك بچین بۆ دارستانەکە. شاسوار بەخۆشحاڵیەوە بەرەو لایان رایکرد. دایکی کڵاوەکەی بۆ لەسەر کردو سەبەتەیەکی بچوکیشی دایە دەستی.



کەگەیشتنە دارستانەکە باوکی ووتی :- شاسوار دەبێ هەوڵی کۆکردنەوەی قارچك بدەیت و لەئێمەش زۆر دوور نەکەویتەوە.

شاسواریش بڕیاریدا کەهەر دەبێ قارچك پەیدا بکات. بۆیە زۆر بە وردی سەیری دەوروبەری دەکرد.

لەپڕ شاسوار رای کردوو بەدەنگی ناسکی منالانەی خۆی، هاواری کرد. ئاااای قارچك !

کاتێ گەیشتە لای لە بری قارچك. لەشوێنیدا، بەردێك بوو.

دووبارە سەیرێکی دەورو بەریکردەوە. لەنێو لەوەڕگاو گژوگیاکاندا تەنێکی



زەردی بینی. شاسوار بیری کردەوە، دەشێ قارچك بێت. بەرەو لای چوو کەدەستی بۆ برد، بۆی دەرکەوت کە گەڵایە، گەڵاکەی هەڵگرت و سەیرێکی کردو درەختێکی بەرچاو کەوت ئینجا تێگەیشت کەئەو گەڵایە لەو درەختە بەربۆتەوە، بەخۆی ووت: بۆچی گەڵا سەوزەکان



بەدرەختەکانەوەن؟ دواتر بۆی دەرکەوت هۆی کەوتنی ئەو گەڵایانە، زەردبونیانە. باوکی کاتێ سەیری شاسواری کرد و گەڵا زەردەکەی لەنێو دەستە ناسك و بچکۆلەکانیدا بینی، وتی: کورم درەختەکان لەسەرەتای پایزدا وردە وردە زەرد دەبن و هەڵ ئەوەرێن، شاسوار گەڵاکەی هەڵدایە سەر زەوی.

شاسوار دیسان درێژەی بەهەوڵو کۆششەکانیدا. لەنێو لەوەڕگاکەدا شتێکی بینیو بەرەو ئەولایە رایکرد. شتەکەی هەڵگرت، بەڵام ئەوتەنە کە ڕەنگی قاوەیی بوو، قارچك نەبوو بەڵکو میوەی درەختی کاژ بوو. لەگەڵ خۆیدا بیری کردەوە کەبەدەستی چ کەسێ و چۆن چۆنی بەری درەختی کاژ کەوتوە؟ لەو کاتەدا دەنگێك سەرنجی ئەوی بۆ لای خۆی ڕاکێشا.

شاسوار مشکێکی بینی کە بەخێرایی بەدرەختێکدا هەڵدەزنا. ئینجا بۆی



دەرکەوت کە ئەومشکە ئەو میوەیەی هێناوەو خستویەتی.

شاسوار دوبارە سەیریکردو ئەمجارەیان قارچکێکی پنتك پنتکاوی رەنگاو رەنگی لەناو لەوڕگاکاندا بینی خۆشحاڵ بوو. بەڵام باوکی هاواریکرد شاسوار دەستی لێنەدەی چونکە ئەوجۆرە قارچکانە ژەهراوین. شاسوار بەباوکی وت: باوکە گیان! ئەبێ هەوڵ بدەم قارچك پەیدا بکەم.





ئەمجارەش بەجارێ هاواریکرد:- وای قارچکێکی سپی!

شاسوار ڕایکرد بەڵام کاتێ گەیشتە شوێنەکەو ئەو شتە سپییەی هەڵگرت، زانی کە توێکڵی هێلکەی باڵندەیە، بەڵام لەکوێوە هاتوەتە ئێرە. سەیرێکی ئەملاو ئەولای کرد. لەسەر درەختەکە هێلانەی دوو باڵندەی دارکونکەرەی بینی، بۆی دەرکەوت توێکڵەکان هی هێلکەی ئەو باڵندانەن.





دەوروبەری نیوەڕۆ بوو. شاسوار سەیرێکی دایكو باوکی کرد بینی هەردووکیان شەکەتو ماندوون بەڵام ئەم هیلاك نەبووەو هێشتا بەهیوای قارچك پەیدا کردن بوو.

لەهەمان کاتدا لەپشت دەوەنەکانەوە شتێکی بەدیکرد، بەرەو لای چوو. دیسان قارچك نەبوو، بەڵکو باڵندەیەکی جوان بوو.

کاتێ شاسوار نزیك بۆوە، باڵندەکەلە شەقەی باڵیدا و هەڵفڕیو شاسوار چەند هێلکەیەکی بینی. ئەمە بەلای شاسوارەوە زۆر سەرنج ڕاکێش بوو. کەوتە بیرکردنەوەیەکی قووڵو قسەی دایکیشی هاتەوە یاد کەوتبووی هێلکەی باڵندەکان بۆ ئەوەی ببن بەجوجەڵە پێویستیان بەگەرمایی دایکیان هەیە. ئەمجا بزەیەکی بۆ کردو وتی؛ تێگەیشتم باڵندەکە لەسەر هێلکەکان کڕ کەوتبوو تا ببنە جووجەڵە.

بەڵام کاتێ لێیان وردبۆوەو دەستی لێدان منداڵ ئاسا وتی:- باوکە هێلکە نییە قارچکە! هەڵی گرتنو خستینە





سەبەتەکەوە. خۆشحال بوو و دەیویست دوبارە لەدەرو دەشتەکەدا بەدوای قارچکدا بگەڕێ. کە گوێی لەدەنگی دایکی بوو وتی:- شاسوار وەرە نانی نیوەڕۆ بخۆین ئەویش بەخۆشحاڵییەوە بەرەو لایان ڕۆیشتو بینی ئەوان خواردنیان لێڕاخستوەو ئەیانەوێ خواردن بخۆن. لەتەنیشتیاندا لێدانیشتو باوکی لەدایکی پرسی قارچکت پەیداکرد؟، ئەویش سەبەتە خاڵییەکەی نیشاندا. دایکی لە باوکی پرسی ئەی تۆ ؟ ئەویش سەبەتە خاڵیەکەی نیشاندا. ئەوجا شاسوار زەمیلە قارچکەکەی نیشاندان دایك و باوکی شادمان بوون و دەستی سۆزیان بەسەریدا هێناو ماچیان کردو وتیان. شاسوار ئافەرینت لێبێت لەبەر ئەوەی تۆ وورد بینتر بویت سەرکەوتوبیتو ئەمەش مانی ئەوەیوەیە کەگەورە بوویت، شاسواریشزۆر دڵخۆشبوو سوپاسیانی کرد ■



سەچاوە/ لوکاس د. جنگل قارج

نوسینی/ تاتاج نا رایف

چیانا:

# ئارەزوومە ببم بەپزیشکی مندالآن



چیانا مەعروف ئەحمەد تەمەن (٨) سالآنە و دانیشتوی شارۆچکەی چوارقورنەیەو منداڵێکی ژیر و زیرەکە، ئەگەرچی چیانا ناتوانێت بەتەواوی لەسەر قاچەکانی بوەستێت بەلآم نەیهێشتووە لەژیانی ئاسایی دابڕێت و بەردەوام وەك هەر منداڵێکی تر رەفتاری کردووە.

چیانا لەقوتابخانەیەو پۆلی دووەمی سەرەتاییە، لەوانەکانیزۆر زیرەکە، پار بەیەکەم دەرچووە تا ئێستا چەندین سوپاسنامەی لەلایەن مامۆستایەکانیەوە بۆ هاتۆتەوە.

چیانا ناتوانێ رۆژانی بەفرو باران بەتەنها بڕوات، بۆیە دەبێت یەکێکی لەگەڵدا بێت تا بیگەیێنێتە قوتابخانە.

چیانا دەڵێت : ( کاکەم زۆر خۆش دەوێت ، لەکاتی چوونە قوتابخانەم و لەزۆر شتی تریشدا هاوکاریم دەکات. ئارەزوو دەکەم لەدوارۆژدا ببم بەپزیشکی مندالآن بۆ ئەوەی بتوانم چارەسەری منداڵە نەخۆشەکان بکەم) ■

ئامادەکردنی: کەیوان سەعید



چیانا لە رێگای چوونیدا بۆ قوتابخانە

---

ئاسا:

# شیرنی زۆر مەخۆن

چۆنن ؟.. من ناوم (ئاسا فەیلی)یە تەمەنم نۆ ساڵە، پۆلی سێیەمم لە قوتابخانەی ئەحمەد هەردیی لەشاری سلێمانی. مانگی پێشوو زۆر نەخۆش بووم، کاتێك منیان بردە نەخۆشخانەی مندالآن دکتۆر وتی: (ئاسا تووشی نەخۆشی شەکرە بووەو پێویستە ماوەیەك لە نەخۆشخانە بخەوێت و دوور بکەوێتەوە لە خواردنی شتی شیرین).



لەنهۆمی پێنجەمی نەخۆشخانەدا خەوتم، رۆژی یەکەم تەندروستیم باش نەبوو بەلآم بەهەوڵی دکتۆر و یارمەتی دایکم دوای چوار رۆژ تەندروستیم باشتر بوو، ئێستا بەتەواوی گوێرایەڵی رینمایەکانی دکتۆر دەکەم.

کاتێ لەنەخۆشخانە بووم کۆمەڵێك منالی تریان هێنا کەوەکو من نەخۆش بوون بەلآم لە هەموومان بچوکتر و گوناحتر منداڵێکی تەمەن شەش مانگان بوو.

زۆر سوپاسی دکتۆرەکان دەکەم چونکەلەگەڵما زۆر ماندوو بوون ، منیان زۆر خۆشدەویست منیش ئەوانم زۆر خۆشدەوێت بەهیوام ئەگەر گەورە بووم ببم بەدکتۆرە تا منیش وەك ئەوان خزمەت بە خەڵکی تر بکەم کە پێویستیان بە چارەسەری و یارمەتی هەیە.

داواکارم لە هەموو مندالآن کە خواردنی شیرینی کەم بکەنەوە بۆ ئەوەی دوور بن لە نەخۆشی شەکرە ■



# ماموٚستا... دێو چییە؟

عەلی حەمە رەشید بەرزنجی
نیگار : دەریا شکاك

ئێستاش بەجوانی لەیادمە کە لەپۆلی چوارەمی سەرەتایی دابووم کاتێك ماموٚستاکەمان چیرۆکێکی بۆ گێراینەوە، هەمووومان دامانە قاقای پێکەنین چونکە بەلامانەوە، چیرۆکێکی زۆرخۆش بوو ، ئەوسا وتی کێ چیرۆکێکی خۆشمان بۆ دەگێڕێتەوە.

یەکێك لەقوتابیەکان وتی: ماموٚستا من حیکایەتێك دەگێڕمەوە.

ماموٚستاش وتی : کوڕم حیکایەتیش هەر چیرۆکە.

ئەو سا دەستی کرد بە گێڕانەوەی ئێمەش هەمووومان گوێمان شل کردبوو.دوای تەواوکردنی بەچەپڵە ڕێزان پۆلەکەمان هەژاند بەلاّم وشەیەك لەحیکایەتەکەدا زۆر دووبارە بووەوە ئەویش وشەی (دێو) بوو، بۆیە دەربارەی ئەم وشەیە کۆمەڵێك پرسیار وەك پووره هەنگ لە مێشکمدا گیزەیان دەهات، منیش دەستم بەرز کردەوە، ماموٚستا گوتی: فەرموو چییە؟، گوتم: ماموٚستا(دێو)چییە؟ ، قوتابیەکان دەستیان کرد بەپێکەنین ..

منیش زۆر پەشیمان بوومەوە وسووك لەشوێنی خۆم دانیشتمەوە.

ماموٚستا زانی پێی تێکچوم بۆیە گوتی: پرسیارەکەت جوانە، شتێك کەلێی تێنەگەین پێویستە پرسیار بکەین (پرسیارکردن شوورەیی نییە، شوورەیی ئەوەیە [illegible]

هەرچەندە منیش لەملاوئەولا وشەی دێوم بیستبوو بەلاّم دڵنیا نەبوم کەچییە.

ئیتر ماموٚستا روی کردە خوێندکارەکان و وتی: کێتان دەزانێ دێو چییە؟، یەکێك لەقوتابیەکان هەستاو گوتی:

دێو ئاژەڵێکی زۆر گەورەیەو ددانەکانی زۆر تیژن وچاوەکانی زەقن و هەرکەسێك بیبینێت لێی‌دەتۆقێ)

قوتابییەکی‌تر هەستاو گوتی: راست دەکات ئەوەندە گەورەیە ئەوەندە گەورەیە نەبێتەوە، پێ بەهەرکەسێکدا بنێ وەك هەنجیر پانی دەکاتەوە، توکەکەشی ئەوەندە تیژە دڵێی تیخ و گوێزانە، من زیاتر ترسم لێنیشت.

ماموٚستا یەکێکی تری هەستاند وتی ئەی تۆ چی لێدەزانی ئەویش وتی: رۆژێکیان دایکم دەچوو بۆماڵی پورم منیش زۆر گریام و گوتم: لەگەڵ خۆتدا بمبە ، دایکم گوتی: رۆڵە ناتبەم، چونکە جارجارێك دێوەکە لەرێگای ماڵی پورت دەوەستێت هەروای وت وخەریك بوو میز بکەم بەخۆمدا ئیتر گوتم: نانا دایە نایەم بۆخۆم لەماڵەوە یاری دەکەم. ئیوارە کە دایکم هاتەوە گوتم: دایە دێوەکەت بینی؟ ئەویش گوتی بەڵێ، منیش گوتم ئەو چۆنە؟، ئیتر دایکم گوتی: رەشێکی زلەی تووك درێژی ناشرینە، توکەکانی دەڵێی درکن هەرقاچێکی بەقەد گایەك دەبێت، ددانەکانی هەروەك دەمەتەورە. لەوکاتەدا شتی وا بەخەیاڵمدا دەهات هەر ئەوەندە بوو هاوارم نەدەکرد.

ماموٚستا بەهێمنی گوتی: نانا بەهەڵە تیانگەیاندوون دێو باڵدارێکی بچووکە، هەرئەوەندەی مێشێك دەبێت هەر کەبەدەست گرتت دەفلیێتەوە ودەیکوژێت، بۆیە واشیان پێتان گوتوە بۆئەوەی لێی بترسن، خۆکەستان نەتان بینیوە؟. لەم کاتەدا زەنگەکە لێیداو منیش کەوتمە گومانەوە، چەند رۆژێکی تر هەمان پرسیارم لەماموٚستا کردەوە ئەویشبەهەمان شێوەی پێشو وەلاّمی دامەوە.تا بۆ رۆژی دوایی مێشێکی لەشو شەیەکی بچوکدا هینا وبەدەستکێشێکی لاستیك لەبەرچاوی قوتابییەکان ئەمە ئەو دێوە بوو کەمنێوە لێی دەترسن ئیتر لەو رۆژەوە دودڵیەکەم نەماو یەکلابوومەوە چونکە تێگەیشتم کە دێو شتێکی خەیاڵییە ■

# منالێکی بچوک وبەهرەیەکی مەزن



هەر یەك لەئێمە کەسایەتیەك لەکۆمەڵگادا دروست دەکات و لەمنداڵییەوە تا گەورە دەبێت ئەو کەسایەتیەش مەزنترو گەورەتر دەبێت.

(ئەحمەد سالح) منداڵێکی لە قوتابخانە سەرکەوتووە جگە لەمەش خەریکی بەدیهێنانی حەزو ئاواتەکانیەتی ئەحمەد بەم شێوەیە بۆمان دوا:-

■ لەپۆلی پێنجەمی سەرەتایم لەقوتابخانەی (هەوارە بەرزە)، هەموو رۆژانی پێنج شەممە کاتێك ریز دەکرێین وتاری هەفتانەی قوتابخانە دەخوێنمەوەو وتارەکەش هەر خۆم دەینوسم .

■ لە پشوی هاویندا خۆم بەخۆشنووسیو کتێبی چیرۆك وگۆڤار خوێندنەوە خەریك کرد کە بەراستی زۆر خۆش و بەسوود بوون. هەروەها دەتوانم هەرشتێك لەبەر دەممدا دابێت وێنەی بکەمەوە.

■ ئەم هاوینە سێ خولی فێرکاریم بینیوە کەدووانیان بۆ زمانی ئینگلیزی بوون ئەوەی تریشیان بۆ کۆمپیوتەر.

■ لەبەرنامەکانی تەلەفیزیۆنی سەیری کارتۆنی (کاتۆلیو شیر فرۆش) کردووە هەر وەها سەیری بەرنامەکانی تەلەفیزێنی پەروەردە دەکەم.

■ لەئەنجامی ئەو چالاکیانەمدا و لەبەر ئەوەی بەیەکەم دەرچووم سەرپەرشتیاری قوتابخانەکەم وێنەیەکی فۆتۆی منی وەرگرتووەو بەگەورەیی لەگەڵ ناوی خوێندنگاکەم بە دیواری دەرەوەدا بەرز هەڵواسیوە.

■ هیوادارم کەگەورە بووم ببم بەئەندازیار و سوپاسی مامۆستاو خێزانەکەشم دەکەم کە هاوکاری وپشتگیریم لێدەکەن.

ئامادەکردنی: داستان خالید

# کێ دەوێرێ زەنگۆڵەکە لە ملی پشیلە بکات؟



نیگار : دەریا شکاك

ماڵێکی کۆن هەبوو . ئەو ماڵە کۆنە چەند مشکێکی تێدا دەژیا، هەر لەوێش پشیلەیەك دەژیا. پشیلەکە هەموو رۆژێ مشکێکی دەخوارد . مشکەکان نەیاندەزانی چی بکەن . رۆژێك هەموو کۆبونەوە گوتیان ئێمە چی بکەین؟ ئاوا بڕوا ئەو پشیلە بەدکارە هەموومان دەخوات . مشکێکی بچکۆلە گووتی: من دەزانم دەبێت چی بکەین، ئەو پشیلەیە بۆیە دەتوانی ئێمە بگرێ چونکە گوێمان لە دەنگی پێی نابێت ئێمە دەبێ زەنگۆڵەکی لە ملدا بکەین تاکو ئەگەربۆ لامان هات، بە دەنگی زەنگۆڵەکە هۆشیاربینەوەو راکەین و بۆی دەرچین .

هەموو مشکەکان ووتیان زۆر باشە ئیدی ئەو پشیلە بەدفەرە ناتوانێ جیتر ئێمە بگرێ ، مشکەکان کردیان بە شادی و خۆشی .

مشکێکی پیر پێی گووتن: بیرۆکەیەکی چاکە، بەڵام زۆر گەشبین مەبن چونکە کامەتان دەوێرێ ئەم زەنگۆڵەیە لە ملی پشیلەکە بکات؟ ■

لە پاشکۆی منداڵانی گۆڤاری ( مەهاباد) وەرگیراوە

# وانەکانی فێربوونی کۆمپیوتەر بە ئاسانی

■ دیاری جەمال



## چاپکەر
## printer



یەکێك لەئایکۆنەکانی my computer لێی نوسراوە printer لە رێگەی ئەم بەشەوە جۆری چاپکەرەکە دەست نیشان دەکەین چونکە لەوانەیە زیاتر لە یەك چاپکەر بە کۆمپیتەرە کەمانەوە بەسترابێت یان دابەزێندرا بێت،

وە بۆ سڕینەوەی چاپکەرێکیش لە کۆمپیتەرە کەماندا ئەتوانین لەرێگەی ئەم بەشەوە بیسڕنەوە یان بیکەین بە چاپکەری سەرەکی کۆمپتەرەکە.

بۆردی دەست بەسەر داگرتن(کۆنتڕۆڵ کردن) control panei:




ئەم بەشە بۆ چاککردن وهەڵبژاردنی جۆرەها فرمانە بەسەر کۆمپیتەرەکەتدا وهەموو کۆمپیتەرەکەی لەخۆی گرتووە بەهۆی ئەمەوە هەر گۆرانکارییەك کەبمانەوێت لەکۆمپیتەرەکەدا بیکەین، بەلاَم دەستکاری کردنی ئەم بەشە پێویستی بەشارەزایی زۆر هەیەو نابێت هەرلەخۆمانەوە دەستکاری بەشەکانی بکەین، چونکە دەسکار یکردنی بەناشارەزایی لەوانەیە ببێتە هۆی تێکدانی کۆمپیتەرەکە وبەرنامەکانی ناو کۆمپیتەرەکە.

**دەست پێکردن** (ستارد start)

بەشێکی زۆر گرنگ هەیە لەسەر شاشەی کۆمپیوتەر کە ئەکەوێتە سوچی لای چەپی خوارەوەی شاشەکە، دەتوانین بەهۆیەوە بچینە ناو زۆربەی بەرنامەکان، لەرێگەی ئەم دوگمەیەوە ئەتوانین ئەو بەرنامانەی کەلەناو کۆمپیوتەرەکەدا هەیە بیکەینەوەو ئیشی تێدابکەین.

ئێمە لێرەدا تەنها بەرنامەی مایکرۆسۆفت وۆرد دەخوێنین ودەچینە ناو بەشەکانیەوە،




چونکە بەرنامەیەکی سەرەکییەو پێویستە هەموو کەسێك ئەگەر بیەوێت لەبەرنامەکانی ویندۆز کار بکات شتێك لەم بەرنامەیە بزانێت.

کاتێك کلیك لەسەر دوگمەی (Stsrt ستارت)کلیکی ووشەی programs واتا بەرنامەکان ئەکەین و بەمە لینێکی ترمان لەتەنیشت لیستەکەی ترەوە بۆ ئەکاتەوە، پاش ئەوە ئەچینە سەر ووشەی مایکرۆسۆفت وۆرد Microsoft Wordو کلیکی لەسەر ئەکەین بەلای چەپی ماوسەکە .

ئەگەر هەندێ چاوەڕێ بکەین ئەوا بەرنامەی مایکرۆ سۆفت وۆردمان بۆ ئەکاتەوە کەرووکاری بەرنامەکە بەم شێوەیەی لای خوارەوە.




ئەم وێنەیەی سەرەوە بەرنامەی مایکرۆ سۆفتمان پیشان دەدات کەوا بەشەکانی لەسەردیارە، وە بەشەکانی تریش وەکو لەپێشەوە باسمان کرد بریتین لەتوڵی ناونیشانTitle bar تووڵی لیستە کراوەکان menu bar تووڵی شۆرت کەتەکان short cut barتووڵی زانیاری Status bar لەگەڵ روبەری چالاك selection barکە ئەم بەشانە وەکو وتمان بەپێی جۆری ویندۆزەکە دەگۆڕێ.

## بەرنامەی مایکرۆسۆفت وۆرد
## Microsoft Word

ئەم بەرنامە سەرەکیترین بەرنامەیەلە مایکرۆسۆفت ئۆفیس Microsoft officeمایکرۆسۆفت ئۆفیس کۆمەڵێکی زۆر بەرنامەیە کە ئەتوانین بۆ ئیشی رۆژانەمان بەکاری بهێنین، وەکو بەرنامەی ئێکسڵ و وۆرد وپاوەرپۆینت وئەکسز..هیتد کەهەریەکەو بۆکارێکی تایبەت بەکار دێت، بەرنامەی وۆرد کەئێمە لێرەدا باسی دەکەین بەرنامەیەکی گشتییە، بەواتا زور شتی ناو بەرنمەکانی تری تێدایە کە دەتوانین تیایدا بکەین ووە ئەگەر مایکرۆ سۆفت وۆرد فێر بوویت ئەوا بەرنامکانی تر بەئاسانتر فێر دەبیت.

ئێستا بابێینە سەربەرنامەی مایکرۆسۆفت وۆرد .هەر کە بەرنامەکە ئەکەینەوە خۆی لاپەرەیەکی سپیمان دەداتێ، دەتوانین یەکسەر شتی تێدا بنوسین یان وێنە و شتی تری بۆ بهێنین، وە ئەگەر لاپەرکەش تەواو بوو ئەوا کۆمپیتەرەکە خۆی لاپەرەیەکی ترمان دەداتێ.

ئەگەر نوسین وئیشەکانمان لاپەرەیەك بوو یان زیاتر ئەوا پێی دەڵێین (فایل File)، ئیتر لەمەولا هەر کەناوی فایلمان هێنا ئەبێ بزانین کەلاپەرەیەك یان چەند لاپەرەیەکە ونوسین یان شتی تری لەسەرە.

ئەگەر ویستمان شت بنووسین، ئەوا یەکسەر ئەتوانین بەهۆی (کیبۆرد-Key Board)ە وە دەست بکەین بەنوسین، بەلاَم بالەپێشەوە فێر ببین چۆن بەشێوەیەکی راست ودرووست دەست دەکەین بەنوسین ■



# شەوی هێڵدا

گۆڕینی لە ئینگلیزی و فارسیەوە:
كەمال ڕەشید

١- هەبوو نەبوو پیرەژنێك هەبوو ناوی هێڵدا بوو، لەكولبەیەكی خنجیلانەی گوندی هێگزامدا دەژیا كەدەكەوتە سەر گردۆڵكەیەكی جوان.





٢- هێڵدا، شەوی خۆشنەدەویست و رقیشی لەهەموو ئەوشتانە بوو كە لەشەودا هەبوون وەكو شەمشەمە كوێرەو كوندەپەپوو و مشك.



٣- هێڵدا لەبەرئەوەی رقی لەشەو بوو، بە هەمان شێوە رقی لەدیاردەكانی شەویش بوو، رقی لە پەروانە، ئەستێرە، خەو، سێبەرو تەنانەت لەمانگە شەویش بوو.



٤- شەوێك هێڵدا بەسەگە پیرەكەی خۆی گوت: ئەگەر بتوانم شەو لە هێگزام دەربكەم، ئەوا بۆ هەتا هەتایە، هەتاو لەكوخەكەماندا هەڵدێت.

پیرەژنەكە درێژەی دایەو وتی: نازانم بۆچی پێشتر كەس بیری لەدەرپەڕاندنی شەو نەكردۆتەوە؟ ، ئینجا لەلق و گەڵای درەختدا گەسكێكی دروست كردو لەكولبەكەی و گردۆڵكەی هێگزامدا كەوتە راماڵینی شەو.

هێڵدا دەستی بە گسكلێدان و تەكاندنیماڵەكەی كرد، هەموو شوێنێكی پاككردەوە، چەند جارێك ئەوكارەی دووبارە كردەوە بەڵام هەركاتێك لەپەنجەكەوە دەیڕوانی، دەیدی وا شەو هەرلەشوێنی خۆیەتی .



٥- ئینجا هێڵدا بیری لەدروستكردنی كیسەیەكی گەورە كردەوە تا پڕی بكا لەشەو و بیبات لەپشت گردی هێگزامەوە خاڵی بكا، بۆئەم مەبەستەش سۆژەن‌و پارچەی تایبەت بە دروستكردنی جۆرك هێنا.





٦- كیسەكەی بەشان داداو زۆر خۆی ماندووكرد، تەنانەت خۆی لەپشت سێبەرەكانیشدا شاردەوە، بەڵام نەیتوانی شەو بگرێ‌و بیخاتە ناو كیسەكەیەوە.



٧- ئینجا هێڵدا مەنجەڵە مسینە قورسەكەی هێناو خستییە سەرئاگر بۆئەوەی شەوی تێدا بكوڵێنێ. بەكەوگیر كەوتە تێكدان‌و لێكردنەوەو تەنانەت تامكردنی شەو پاشان سووتاندنی، بەڵام شەو لەوە زرنگتر بوو پیرەژن بتوانێ بیسوتێنێ.



٨- پیرەژن ویستی شەو ببەستێتەوە، بۆیە كەوتە كۆكردنەوەی قەدە نەرم‌و ناسكەكانی دارمێوو وتی(لەوانەیە بیبەمە بازارو یەكێ لێم بكڕێ). بەڵام دیسانەوە شەو سرك بوو، نەگیرا.



٩-هێڵدا مقەستی خوری برینەوەکەی خۆی هێنا تا خوری و باڵی شەو. وەك بەرخێکی دەستەمۆ ببڕێ، کەوتە مقەست لێدان، بەڵام تەنها پەڵە هەورێکی رەش کەوتە سەر زەوی و شەو هێشتا هەموو شوێنێکی گرتبوو.



١٠- پاشان هێڵدا شەوی بۆ سەگە پیرە شکاریەکەی تورڕدا تابیخوا، بەڵام ئەویش نەیتوانی شەو بگرێ و قەپاڵی لێگیرکا.



١١-پیرەژن شەوی گرتو خستیە ناو سیسەمە حەسیرەییەکەوە، بەڵام شەوی بزێو توانی دەرپەڕێتە دەرەوە.



١٢- ئینجا هێڵدا شەوی فرێ دایە ناو بیرەکەی پشت کوخەکەیەوە، کەچی شەو دیسان دەستەمۆ نەکراو دەرپەڕی.



١٣-پاشان پیرەژن بەمۆم کەوتە سوتاندنی کلکی شەو، بەڵام دیسان شەو خۆی دەربازکرد.



١٤- پاش ئەوەی هێڵدا زۆر ماندوو بو شەوی لە ئامێز کرت و لاواندیەوە تا خەوی لێبکەوێ. بەڵام شەو منداڵێکی چەقاوەسوو بوو نەخەوت.



١٥- جامێکی پڕشێوی بۆ شەو دانا،تابیخواتەوە، بەڵام ئەویش سودی نەبوو.





١٦- بەو پەڕی تورەییەوە قیژاندی بەسەر شەودا. تەنانەت روخساری شەویشی بەدووکەڵ قانگدا.



١٧- بەپێ لەقە و شەق کەوتە گیانی شەو و پاشان گۆرکێ بۆ هەلکەند. بەڵام هەر سودی نەبوو



١٨- هێڵدا بەڕادەیەك لەدەست شەو تورە ببوو، نەفرەتی کرد و تەنانەت (داوای لێبوردن دەکەم) تفیشی لەشەوکرد، بەڵام شەو هەر بەر قەرار بوو.



١٩- شەو هەر باکیشی لەو کردەوانەی هێڵدا نەبوو. بۆیە پیرەژن هەناسیەکی ساردی هەلکێشا و وتی: (کەواتە دەبێ منیش باکم لەشەو نەبێ). ئینجا پشتی لەشەو کردو گەڕایەوە خانوەکەی.



٢٠- لەو سەرو بەندەدا تیشکی هەتاو گردۆلکەی هێگزامی روناك کردەوە، بەڵام هێڵدا هێندە بەشەڕی شەوەوە ماندوو ببوونەیتوانی چێژ لەخۆشی ڕۆژ وەرگرێ.





٢١- پیرەژن بۆ پشوودانو خۆئامادەکردن بۆشەڕی شەوی داهاتوو، چووە ناو سیسەمە حەسیرییەکەیەوەو خەوێکی قووڵ خەوت ■

تەواو بوو

## جیاوازی

وێنەی یەکەم لەگەڵ وێنەی دووەمدا هەندێ جیاوازی هەیە، ئازاو زیرەك ئەو کەسەیە کە بە زووترین کات ئەو جیاوازیانە بدۆزێتەوە.






باخی هزر



## ڕەنگم بکە

بۆ ئەوەی ئەژدیهاکە نەمخوات تکایە ڕەنگم بکە

## هێلکێشان

ئەگەر لە ژمارە (١) تا دەگەیتە ژمارە (٢) بە پێنووسێك هێل لە خاڵێکەوە رابکێشیت بۆ خاڵی دواتر ئەوا لە کۆتایی نیگارێکی جوانت بۆ دەردەچێت.



# وێنەی دوو ڕوو

ئەوەی یەکەم جار سەیری ئەم وێنەیە دەکات جەنگاوەرێکی سەردەمی کۆنی بۆ دیاردەکەوێت کە بە رمێکەوە لەسەر پشتی ئەسپەکەیەتی

بەڵام ئەگەر بە سەرەوخواری واتە بە هەڵگەراوەیی سەیری وێنەکە بکەیت ئەوا شتێکی ترت بۆ دەردەچێت .

ئەگەر باوەڕ ناکەیت تاقی بکەرەوە ! ■



# ونبوون



ئێرە شاری یارییە و جەژنە بەڵام ئەو کابرایە بەو بڵندگۆیە هاوار دەکات و دەڵێت : هۆ خەڵکینە ئەو شەش شتانەمان لەناو شاری یاریدا لێ ون بووە تکایە بە زووترین کات بۆمان بدۆزنەوە ■




# بیچووە کەنگارۆ

ئێرە کیشوەری (ئوسترالیا)یە ، ئێرە بەوە بەناوبانگە کە ئاژەڵی کەنگارۆی لێیە، کەنگارۆ یان کەنگەر بەوە ناسراوە کە حەزی لە یاری و وەرزشە بە تایبەت بۆکسێن.

سێ گۆڵارە هەڵدراونەتە ئاسمان بەڵام تەنها یەکیان هی بێچووە کەنگارۆیە، کامەیانە ؟ ■



# تەمبەڵی

وریابن وەك ئەو ژن و پیاوە تەمبەڵـەتان لێنێت کە بەردەوام بەدەم خواردنەوە لە دیار تەلەفزیۆنن ■





# دوو بچکۆل

وەرگێڕانی :
دڵنیا رەزا پور (سوید)

هەبوو نەبوو زەمانی زوو پیرەمێردێکی پینەدۆز و پیرەژنێك هەبوون، لە دونیادا لە هیچیان کەم نەبوو تەنها منداڵ نەبێت



وەك هەموو شەوێك ، پینەدۆز پێش خەوتن کەلوپەلی پێلاو دروستکردنی لە پێستەو کەفەو مێخ و بزمار ئامادەکرد.



کەلوپەلەکانی لە نزیك پەنجەرەکە دانا تا بەیانی زوو پێلاوێك دروست بکات.



بەیانی کە پیرەمێرد هەڵساو بۆ لای کەلوپەلەکانییەوە چوو، حەپەسا، زۆر لای سەیر بوو چونکە ئەو پێلاوەی کە بە نیاز بوو بیدورێ و چاکی بکات ، دروستکرابوو، بەڵام کێ دروستی کرد؟ ئەوەیان پیرەمێرد سەری لێسوڕما بوو.





خاوەنی پێلاوەکەش زۆر رای لەو پێلاوە بوو وتی: هەرگیز پێلاوی وام نەبینیوە بۆیە فەرموو ئەوە دوو ئەوەندەی پارەکەی کە لەسەری رێك کەوتبووین



ئیتر ئەم کارە هەموو شەوێك دووبارە دەبووەوە، کە لەلایەك ببوە خۆشگوزەرانی بۆ پیرەمێرد و پیرەژن، لە لایەکی تریش ببوە هۆی سەرسووڕمان و پرسیار : ئێ ئاخر کێیە ئەو چاکەیان لەگەڵدا دەکات ؟



بۆیە هەردووکیان بڕیاریان دا ئەم شەو لە پشتی پەردەدا خۆیان مەڵاس بدەن تاکو تەواوی مەسەلەکە بزانن و تێبگەن



نیوەی شەو هەستیانکرد کە پەنجەرەکەی لای کەلوپەلەکان دەکرێتەوە، بەڵام کەسیان نەبینی، دوای وردبوونەوەو رامان دوو منداڵی زۆر بچوکیان بەدیکرد.



بێ دواکەوتن هەردوو بچکۆل کەوتنە دوورین و دروستکردنی سۆلەکە، دوای تەواوبوونی پێلاوەکەش بەهەمان شێوەی هاتنە ژوورەوە، دەرچوونە دەروە و بەو گوڵ و گوڵزارانەدا شۆڕ بوونە خوارەوە کە لە ژێر پەنجەرکەدا روا بوون.





پیرەژن و پیرەمێرد سەریان لەم کارە زیاتر سوڕما. پینەدۆز گووتی: ئێ ئاخر ئەوانە ئەو چاکەیە بۆ لەگەڵ ئێمەدا دەکەن.
ژنەکەی وتی: پیاوەکە ئەوانە فریشتەن و دەزانن ئێمە کەسمان نییە ، بۆیە هاوکاریمان دەکەن







بۆ شەوی داهاتوو پیرەژن و پیرەمێرد چەندین جووت پۆشاك و پێلاوی چاك و جوانیان بۆ دوو بچکۆلەکە دووری و لەسەر مێزەکەیان دانا.



پاشان بە رێگای خۆیاندا چوونە دەرەوە، بەڵام بە پۆشتەیی .

دوو بچکۆل بە خۆشییەوە جلەکانیان پۆشی و کەوتنە سەماکردن .

وەك هەموو شەوێك دوو بچکۆل هاتنەوە بەڵام ئەمجارەیان لەبری پێستەو بزمار جلوبەرگی جوان و رەنگاورەنگی بچووك بچوك دانرابوو



ئیدی پیرەمێرد و پیرەژن وەکو هەموو ژن و پیاوێکی ئەو دونیایە بێبەش نەبوون لە سۆزی و خۆشەویستی دایکایەتی و باوکایەتی.



# ئافەرین مامۆستا سۆران



مامۆستا سۆران جەلال ئەحمەد خەڵکی ناحییەی خورماڵە، مامۆستایە لەقوتابخانەی دێکۆنی خورماڵ لەلایەن خۆیەوە هەستاوە بەوتنەوەی چەند وانەیەکی هۆشیاری مین. کە تێیدا زیاتر لە(٢٥) قوتابی سودیان لێ وەرگرتووە.

مامۆستا سۆران دەڵێت:-کاتی خۆی لەپەیمانگای مامۆستایان چەند وانەیەکمان دەربارەی مین وەرگرت هەروەها سوودم لە کتێبی هۆشیاری مین وەر گرت.

ئەم کارەی مامۆستا سۆران بێ گومان سوود بەخش بووە، دەست خۆشی لێدەکەین بەڵام ئەوە کاتێك بوو کە تیمەکانی رێکخراوی کودستان بۆ هۆشیار کردنەوە لە مین (KOMA)نەگەیشتبوونە ناوچەکە بەڵام ئێستا تیمەکانی هۆشیاری (KOMA)تا دواین خەتی سنوور چالاکی هۆشیار کردنەوە لە مین و تەقەمەنی دەنوێنن ■

پەیامنێری شارەزوور : سەرحەد هەڵە بجەیی

# ئەسکیمۆ: مرۆڤی ناو سەهۆڵ بەندان

**ئامادە کردنی: عەبدول خالید سابیر**

وولاَتی ئەسکیمۆ ناوچەیەکی فراوانە کە پێوانەکەی (١٥) هەزار کیلۆ مەترەو لە باشووری دورگەی (گرینلاند)ـەوە دەست پێدەکات تا باکووری (ئیبرادۆر) لەوێشەوە تا ئەوپەڕی باکووری (ئالاسکای)ئەمریکای باکوور لـە کیشـوەری ئاسیاش لـە کەنارەکانی (سیبریا)دا هەن.



ئەسکیمۆیەکان لەچەند خێڵ وهۆزێك پێك هاتوون کە بەهەموویان ژمارەیان ناگاتە ملیۆنێك کەس.

## ناوی ئەسکیمۆ

ناوی ئەسکیمۆ چەند واتایەکی هەیە بەلاَم لە راستیدا بەواتای (ئەو کەسانەی




گۆشتی کاڵ دەخۆن) دەگەێنێت، واتا ئەو کەسـانەی کەگۆشـت بـەبێ برژانـدن وکولاَندن دەخۆن.

بەلاَم ئەسکیمۆیەکان ناوی خۆیان بـۆ واتایـەکی تـر دەگێڕنـەوەو دەڵێـن واتـای (پیاوە نایابەکان)دەگەێنێت.



## کۆمەڵگەی ئەسکیمۆ

خـوو رەوشـتی کۆمەلاَیـەتی بـەتین ئەسـکیمۆیەکان بەیــەکتر دەبەسـتێتەوە، زمانیشیان جیایە.

ئەسکیمۆیەکان پەیوەست نین بەیاسای تایبەتـەوە، بـەلاَم چـەند رێسـایەکیان لـەنێواندا هەیـە کەپـەیوەندی ئـەندام و هۆزەکـان بەیەکـەوە رێـك دەخـات ئـەو رێسایانەش کۆنـن و لە باپیرانیانـەوە بۆیان ماوەتەوە، هەموو کەسێك لەولاَتی ئەسکیمۆ لەمافدا یەکسانەو کەسیش خاوەنی مـاڵ و



خانووی ئەسکیمۆییەکان لە پارچە بەفری گەورە دروست دەکرێت

کەلوپـەلی خـۆی نییـە بـەڵکو هـەموو ئەندامانی هۆز بەشدارو یەکسانن لە موڵك داریەتیدا.

## گوزەرانیان

ژیـانی ئەسـکیمۆیەکان زۆر ئاسـاییەو لەسـەر راوکـردن دەژیـن، راو و شکاریشیان برتییە لەراوی ماسی وسەگاو ونەهەنگ.



## ولاَت پارێزی

لـە سـەدەکانی رابـردوودا لـەزۆر شوێندا ناوچـەکانیان لەلایـەن ولاَتـانی تــری ئــەورووپی داگـــیرکراون، ئەسـکیمۆیەکان توانیـان بـەرگری زۆر لەولاَتی خۆیان بکەن.




## ئەسکیمۆی ئێستا

ئێسـتا ئەسـکیمۆیەکان تێکـەڵ بەکۆمەڵگـەی نوێـی سـەردەم بـوون بـە جۆرێك ئەوانـەی کەلەئالاسکای ئـەمریکا دەژیـن بونەتـە هـاوولاَتی ئەمریکایی و ئـەوانی تریـش هـاوولاَتی (کەنـەدا)یـین ئـەوانی گرینلاندیـش هاولاَتی دانیمارکین ■



راوچییکی ئەسکیمۆیی





منداڵانی ئەسکیمۆ بەرگەی سەرماو سەهۆڵبەندان دەگرن



گالیسکەیەك کۆمەڵە سەگێك رایدەکێشن



جلوبەرگی دروستکراو لە پێستە مووی ئاژەڵ

# کاری تازەی پشیلە

چیرۆکی : زەکەریا تامر
وەرگێڕانی : ئەحمەد قادر سەعید



بێچوە پشیلەیەکی سپی دەستەمۆ، چۆلەکەی زۆر خۆشدەویست و هەولی نەدەدا هێرش بکاتە سەریان بەڵکو هەر گوێی لە گۆرانیەکانیان دەگرت. رۆژێك بێچوە پشیلە بەچۆلەکەیەك گەیشت، چۆکەکە لێی پرسی:-

– تۆ چ کارێك دەکەیت ؟. بێچوە پشیلەکە وەڵامی دایەوەو گوتی :-

ڕاوی مشك دەکەم. بە گاڵتە کردنەوە چۆلەکەکە پێکەنی و بەپێناخۆشبونەوە گوتی:-

– ئەوە چ کارێکە، چەند قێزەونە؟! ئینجا دەستی بەفڕین کردەوەو دووبارە بەوکارە دزێوە دەستی بەپێکەنین کردەوە.

بێچوە پشیلەکە چەند رۆژێك زۆر دلگران بوو، کاتێك گەیشتە پشیلەیەکی بەتەمەن، رووداوەکەی بۆ گێڕایەوە، پشیلە گەورەکە پێی گوت:-

– پێویست ناکات خۆت بەپیشەی راوکردن دلگران بکەی، ئەوە ئیشی ئێمەیەو کارێکی خۆشە سوودیش بەمرۆڤ دەگەیێنێ، چونکە لەگیانلەبەرێکی زیانبەخش رزگاریدەکات.

بێچوە پشیلەکە گوتی:-

– ئاخر ئەوە کارێکی قێزەونە. پشیلە بەساڵاچووەکە گوتی:-

– پێویست بەدڵتەنگی و شڵەژان ناکات، مادام ئەو کارەت پێناخۆشە وازی لێبێنەو لێی دووربکەوە.

بێچوە پشیلەکە گوتی:- من نامەوێ بێکار بژیم. پشیلە پیرەکە بیری کردەوە ئنجا پێکەنی و بەبێچوە پشیلەکەی گوت:-

– ئیشێکی تر هەیە دەتوانی خۆتی پێوە خەریك بکەی.

بێچوە پشیلەکە هەرخێرا گوتی:-

– ئەو ئیشە چیە؟.

پشیلە پیرەکە بەپێکەنینێکی فێڵاویەوە گوتی :-

– ئەوکارە کاری راوکردنی چۆلەکەکانە، چونکە تۆ کەڵبە و چڕنوکی بە هێزت هەیە. بێچوە پشیلەکە بەقسەی پیرە پشیلەکە دڵخۆشبوو و لەو رۆژەوە خەم دای نەگرتەوە و هەر لەوکاتەشەوە بووە بەو راوچیەی هەمیشە چۆلەکەکان لێی دەترسان ■





# دیاری سەری ساڵ

گۆڕینی بەدەسکارییەوە:
ئیدریس لاوە

دوایـن ڕۆژی سـاڵ بـوو، کەروێشـکەکان خۆیـان بـۆ ئاهـەنگی ساڵی تازە ئامادە دەکرد، کەروێشـکە سمـۆ زۆر بێتاقـەت بـوو چونکـە دەیویسـت دیارییـەك بـۆ (ڤینـا)ی هاوڕێی ئامادە بکات ، دوای بیرکردنەوە وتی: دۆزیمەوە.



کەروێشکە سمۆ چووە لای مریشکە سوورەی هاوسێی و وتـی : مریشـکە سـوورە گیـان سوپاسـت دەکـەم ئەگـەر هێلکەیەکی جـوانم پێببەخشـی چونکـە دەمـەوێت بیکەمـە دیاری سەری ساڵ بۆ خۆشەویسترین هاوڕێم .



چونکە کەروێشکە سمۆ خۆشەویست بوو بۆیە مریشکە سوورە گەورەترین هێلکە خۆی پێبەخشی ئەوەندە گەورە بوو کە هەموو کەروێشکەکانی‌تر سەریان سوورمابوو.





کاتێك کەروێشکە زانای باوکی زانی ئەو هێلکەیە دیاری کوڕەکەیـەتی بـۆ (ڤینـا)ی هاوڕێیـان وتـی: زۆر باشـە دەی کیژو کوڕە ژیرەکانم باپێکەوە دیارییەکە ڕێکبخەین.



کەروێشـکەکان هـەموو پێکەوە هێلکەکەیان نەخشـاند و ڕازاندەوە بەجۆرێك کەروێشکە زانای باوکیان بەپێکەنینەوە وتی : هاهاهاها دەبا بەو پەڕۆیە جوانەش قردێلەیەکی بۆ دروستبکەین ئینجا دەبێت بە هێلکەیەکی ئەفسوناوی.



کەروێشکە سمۆ هێلکە ئەفسوناوییەکەی بارکرد و بـۆ لای ماڵی (ڤینا) بەڕێکەوت کەروێشکە نازەی خۆشکی وتی :سمۆ گیان وریا بە یاری بە پایسکلەکە نەکەی !.



بۆ بەیانی کە ڕۆژی ساڵی نوێ هەڵات و تیشکی زێڕینی بڵاوکردەوە، ڤیناش زۆر دڵخۆش بوو بە هاتنی ساڵی تازە و دەستی بوکەڵەکانی گرت و چونە ناو باخەکەیان.



کاتێك ڤینا لەگەڵ بوکەڵەکانی لەناو باخەکەدا یارییان دەکرد لە پڕ چاویان بە دیارییە جوان و نەخشینەکە کەوت کە لە ژێر گوڵە ڕەزێك دانرابوو



ڤینا زۆر خۆشحاڵ بوو بەم دیارییە و زانی کە ئەو دیارییە هی کەروێشکە سمۆی هاوڕێیەتی بەڵام دوای وردبوونەوەی زیاتر لە دیارییەکە بۆی دەرکەوت کە درزی داوە بۆیە هەڵسا بە کردنەوەی قردێلەکە



هەرکە ڤینا قردێلەکەی کردەوە درزی هێلکەکە گەورەتر و زیاتر بوو تا بەتەواوی شکا. بەم شێوەیە هێلکەکە تروکاو سێ جوجەڵەی جوانی لێ هاتنە دەرەوە.

ڤینا زۆر دڵخۆشبوو بەم دیارییە و شادمان بوو کە ساڵی تازە یەکەمین ڕۆژی ژیانی جوجەڵەکانی بوو ■



# یاریەکی نوێ

وەرگێڕانی: ئەرسەلان حەسەن



١- دایکم وەك هەموو دایکانی دونیا لەو باوەڕە دایە کە منداڵی چاك شەو زوو دەخەوێ. بۆیە منیش بڕیارم دا کەشەوێك منداڵێکی باش بم و زوو بخەوم.



٢- بەڵام کاتێك کەچومە سەر جێگاکەم، بە بیرم داهات کە دەبێ یارییەکی نوێ تاقیبکەمەوە.



٣- نەم دەزانی ئاخۆ دەتوانم لەسەر جێگاکەم هەڵپەڕم یان نا ؟ بەڵام باشە، تاقیکردنەوە باشترین بەڵگەیە، بۆیە بڕیارمدا هەڵپەڕم.



٤- لەراستیدا تاقیکردنەوەیەکی دڵخۆشکەر بوو، هەر بۆیە باوکیشم بانگ کرد.



٥- تا ئەویش لەو تاقیکردنەوە دڵخۆشکەرەدا بەشداری بکات.

٦- هەڵبەتە ئاساییە کەهەر تاقیکردنەوەیەك ئەنجامێکی هەیە.



٧- ئەنجامی تاقی کردنەوەکەی من و باوکیشم ئەوە بوو کەمن ئەم شەویش نەمتوانی منداڵێکی باش بم ■

سەرچاوە(گل ناقای بچەها)

# 2004

## ساڵێکی تر

جەبار سابیر

وا هاتەوە سەری ساڵ
خۆشە بۆ ئێمەی منداڵ
کەبەرگی جوان بپۆشین
تابزانین دڵخۆشین
ئەم ساڵیش مامە پیرە
هاوڕێیەکی دڵگیرە
سەردانی ماڵان دەکات
منداڵان خەڵات دەکات
چاوەڕێین هەتا ئەو دێ
خۆری ساڵی نوێ هەڵدێ

نیگار : دەریا شکاک

## ساڵی نوێ

فەرهاد ئەحمەد بەرزنجی

بەهاتنی ساڵی نوێ
ئێمەی منداڵ دڵخۆشین
گۆرانیشادی دەڵێین
بۆ ئازادی پەرۆشین

ئەمڕۆ خۆشی دەبارێ
لە ئاسمانی نیشتیمان
لە ژێر خۆری ئازادی
رازاوەیە وڵاتمان

ئەمساڵ ئاسودەترین
لەساڵانی رابردوو
هەست بەئازادی دەکەین
چەو سانەوە بەسەر چوو

ئێستا ئەرکی هەموانە
هەڵمەت بۆئاوەدانی
زانست بکەین بەهاوڕێ
بۆ ژینی شارستانی





وەرن با دروستکەین

# هونەری ئۆریگامی

ئۆریگـــامی هونـــەرێکی کۆنـــی ژاپۆنییەکانە کـە پشـت دەبەستێت بە کاغـەز لـە رێـی نوشـتاندنەوەو هـەندێ جاریش نوساندنی بە هۆی کەتیرەوە.

## سوودەکانی

دەتوانـی ئـەو پارچـە ئۆریگامانـە لەیەکبدەیتـــەوەو پارچـــەی باشـــی جوانکــــــاری ژوور و ماڵــــــەوەی لێدروستبکەی هەروەها دەکرێت شێوەی ئاژەڵ و مرۆڤی لێدروست بکەیت ئەوەی خوارەوە نمونەیەکی بچووکە:





KITE

کۆلارە

گۆڤاری منداڵانە



کۆلارە درێژە پێدەری گۆڤاری پەرسێلکەیە

کە یەکەمین گۆڤاری منداڵانی کوردستان بوو

دوای را پەڕین

کارگێڕی دارایی: بارزان عارف

پیتچنین و کۆمپیوتەر :

کەیوان سەعید ، دەرباز ئازاد محەمەد

نەخشەسازی و جیاکردنەوەی رەنگ:

کۆمپیوتەری گۆڤاری کۆلارە

تیراژی ژمارە (٩) : 3200 دانە


## فەرهەنگۆکەی کۆلارە


ئامادەکردنی : مامۆستا شەریف

sharifraza@yahoo.com


**تێبینی:** ئەم فەرهەنگە تەنها ئەو وشا... دەگرێتەخۆ کە لە بابەتاکانی کۆلارەدا هاتو... کە پێویستیان بە روونکردنەوەی زیاتر هەیە.

**ئۆسکار:** پاداشتێکی سینەمایی جیهانییە دەدرێ... ئەو فیلمانەی کە زۆر باشن.

**ئەفسوناوی** : خەیاڵی ، ناڕاست، فەنتازی

**پەروانە:** ئەو پەپوولانەی کە شەو بەدەو... روناکی چراو فانۆسەکاندا دەخولێنەوە

**پۆشتە** : بەجلوبەرگ

**جۆرك** : گونییە : تورەگە: فەردە

**دارکونکەرە:** کویت ، باڵندەیەکە بە دەنوکی قە... دار کون دەکات و دەیکاتە هێلانە.

**دێو** : خێو

**تیم** : تیپ ، گروپ ، شاند

**چەتر** : سەیوانە

**چەتە** : رێگر ، دزی سەر رێگاوبان

**خۆمەڵاسدان** : خۆی شاردنەوەوە: بۆسە

**سۆل** : پێڵاو : پێتاو، کەوش

**زرنگ** : چالاك: وریا، بەدەستو برد، بزێو، زیتەڵ...

**سەبەتە** : زەمبیل

**سەندەویچ** : بابۆڵە (لەفە)

**سوژن** : دەرزی گەورەیە بەکاردێت بۆ دوری... گونییەو فەردەو کورتانی کەر

**شاخ** : قۆچ

**شیو:** شیف ، چێشت ، خواردن، خارن

**کولبە:** خانۆچکە : کوخ : خانوێکی بچووك

**کەڵبە** : ددان ، دان ، دگان ( ددانەکانی پێشەوە)

**گوڵە رەز:** گوڵەباخ

**گردۆلکە** : بەرزاییەکی بچووك : یاڵ

**خاڵیکردن** : بەتاڵکردن

**قێزەون** : زۆر پیس

**ژیر** : زیرەك ، زانا، زۆرزان

**خوان** : سفرەی نانخواردن

**قارچك** : کوارك : کارگ ، خارگ

**مژمژە** : (مەساسە)

**رم:** چەکێکی کۆنە بریتیە لە سەرێکی ئاسنی ت... کە دەسکێکی درێژی هەیە.

**نەخۆشی شەکرە** : نەخۆشییەکە زیتر توش... گەورەکان دەبێت، دەبێتە هۆی تێکچوونی رێژ... ماددەی ئەنسۆلین لە خوێندا.

**چڕنووك** : جنجیرۆك : ئەو لەپەیە کە پشیلە... کاتی شەڕ و بەرگریکردن کە لەبەرامبە... دەدات، مەترسیدارە چونکە نینۆکەکانی زۆر تی...